# پێغەمبەر مووسا و پێوەرە عەقڵییەکان

ناوی نووســـــەر: نهاد جلال حبیب الله
دیزاینی ناوەوە و بەرگ : زەردەشــت کاوانی
نۆبــەتــی چــاپ: یــەکــەم ٢٠٢٠
تـیــــــــراژ: ١٠٠٠ دانـــــــە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی (        ) ی ساڵی ٢٠٢٠ پێدراوە

# پێغەمبەر مووسا

# و

# پێوەرە عەقڵییەکان

نووسینی

نهـــاد جـــلال حبیب الله



# پێشەکیی

قورئانی پیرۆز پڕە لە گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەرانی خوا، نەوەك تەنها چیرۆکێك بێت و بۆ چێژوەرگرتن، یاخود پێدانی زانیارییەکی مێژوویی، بەڵکو وەك خودی قورئان ئاماژەی پێداوە، بۆ سوودوەرگرتن لەو بەسەرهاتانە، واتە ئێمەی موسڵمان راسپێردراوین سوود لە بەسەرهاتی ژیانی پێغەمبەرانی خوا وەربگرین، چونکە لەو پەیامەی کە خوای گەورە بە کۆتای پەیامەکانی داناوە بۆ مرۆڤایەتی و تایبەتە بە نەوەی دوای دابەزینی وەحی هەتا رۆژی دوایی، ئەم وردەکارییانەی بەسەرهاتی پێغەمبەران باسکراون، خوای گەورەش دەفەرموێت:

(وَكُلًّا نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنْبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ وَجَاءَكَ فِي هَذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ)،[١]

(وە هەواڵی ئەو هەموو پێغەمبەرو گەلانەیانت بۆ دەگێڕینەوە، هەتا دڵتی پێ بەهێز بکەین و دڵنیاشتکەین لەراستی کارەکەت، دڵنیاشبە هەرچی بۆت هاتووە، هەق و راستە و پەندو ئامۆژگاریی و بیرخستنەوەشە بۆ بڕواداران)

هەروەها دەفەرموێت:

(لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِأُولِي الْأَلْبَابِ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَى وَلَكِنْ تَصْدِيقَ الَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ)،[٢]

---

(١) هود: ١٢٠.
(٢) یوسف: ١١١.

ASTANA

(سوێند بەخوا لەداستان و سەرگوزەشتەی یوسف و براکانیدا، گەلێ عیبرەت و ئامۆژگاریی مەزن هەیە، بۆ خەڵکانی هۆشمەندو ژیر کە بیکەنە رێ نیشاندەری خۆیان، بۆ دۆزینەوەی هەق و راستی، دیارە کتێبێکی وەکو ئەم قورئانەش، هەرگیز ناشێ قسەوباسێکی هەڵبەستراو بێت، بەڵکو تەصدیق وپشتڕاستکردنەوەیە بۆ کتێبە پێشووەکانی بەرلەخۆی و شیکەرەوەی هەموو شتێکیشە، بەتەواوی بەیانی حەڵاڵ و حەرامی تێدایە و رێ نیشاندان و رەحمەت و میهرەبانی خوایە بۆ خەڵکێ بیەوێ باوەڕ بهێنێت).

لەم روانگەوە، پێمان باش بوو تەوەرێکی دیاریکراوی نێو ژیانی یەکێك لە پێغەمبەرانی خوا وەربگرین، کە ئەویش بواری پێوەرە عەقڵییەکانە لە ژیانی پێغەمبەر مووسادا، بزانین ئەو کاتانەی لێکدانەوە عەقڵییەکان بۆ رووداوێك دەخرانە بەرباس، چەندە لەگەڵ ئەنجامەکەدا یەکیان دەگرتەوە.

یەکێك لە پەندو وانە گرنگەکانی نێو ژیانی پێغەمبەر مووسا کە لە قورئاندا بۆمان باسکراوە، راستکردنەوەی تێڕوانینمانە بەرامبەر رۆڵ و پێگەی عەقڵ لە ئاست ویستی خوادا، چونکە زۆرجار لە ساتە یەکلاکەرەوەکاندا، ناتوانین تێڕوانینی عەقڵ تێپەڕێنین و لە بازنەی بەرتەسکی عەقڵی مرۆییدا خۆمان مۆڵ دەدەین.

بەسەرهاتی پێغەمبەر مووسا کە لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە، بەجوانی ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە، لەودیو لێکدانەوەو حیساب و کیتابی عەقڵەوە، ویستی خوا هەیە، ئەوکاتەی لە روانگە عەقڵیی و واقیعیەکەوە دەگەینە قەناعەتێك، ویستی خوا شتێکی ترە و ویستی خواش پێش لێکدانەوە مرۆییەکان دەکەوێت، بۆ ئەمەش شەش وێستگەی ژیانی ئەو پێغەمبەرە ئولولعەزمە بە نموونە وەردەگرین.

ASTANA

ASTANA

## وێستگەی ١

# لەدایکبوونی مووسا

تاوی لەدایکبوونی پێغەمبەر مووسا، ئەو دەمە بوو کە فیرعەونی نەگریس خەونێکی دیبوو، خەونیش لای میصرییەکان، بەتایبەت بۆ خەونی فیرعەونەکان، بڕیاری لەسەر دەدرا، خەونێك مەرگی هەر لەدایکبوویەکی بەنوئیسرائیلیی پێوەبوو، شەوێك تێنەپەڕی بەسەریدا هەتا بڕیاری مەرگی هەر لەدایکبوویەکی نێرینەی بەنوئیسرائیلی لەسەر درا و دەسەڵاتی جێبەجێکردن راسپێردرا بۆ جێبەجێکردنی.

لەم سەروبەندەدا مووسا لەدایك بوو، هەر بیرکردنەوەیەکی عەقڵیی بۆ ئەوە دەچوو، ئەی دایکی مووسا، ئەگەر ئەتەوێت منداڵەکەت بپارێزیت، درەنگانی شەو و بە نهێنی شار جێبهێڵە، هەر پێناوێك بگرەبەر بۆ شاردنەوەی منداڵەکەت نەبادا سەربازانی فیرعەون دەستیان بگاتە لای.

بەڵام کاتێك خوای گەورە رێنمایی دایکی مووسا دەکات، فەرمانی پێ دەکات بە شتێك کە زۆر سەختە مرۆڤ دڵی ئۆقرە بگرێت و ترسی لێ نەنیشێت:

(أَنِ اقْذِفِيهِ فِي التَّابُوتِ فَاقْذِفِيهِ فِي الْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ الْيَمُّ بِالسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِي وَعَدُوٌّ لَهُ)، [١]

---

(١) طه: ٣٩.

(بیخەرە ناو داربەستە و سندووقێکەوەو بیهاوێژە ناو دەریاوە، با دەریاش بیخاتە کەنارەوە بۆ ئەوەی دوژمنێکی من و دوژمنێکی خۆیشی بیگرێتەوەو بیبات).

کۆرپەیەکی ساوا بخرێتە ناو سەبەتەیەك و بدرێ بەدەم ئاوی نیلەوە، وردبنەوە، دەبێت چەند ترس و ئەگەر ختوورەی کردبێت بە دڵی دایکیدا:

کوڕەکەم ئاو نایبات و ئیتر نەیبینمەوە.

کوڕەکەم نوقمی ناو نیل نەبێت.

دڕندەیەکی دەریایی ئەم کوڕەم نەخوات.

خۆ نیل بەژێر کۆشکەکەی فیرعەوندا تێدەپەڕێت، نەبادا سەربازەکانی بیبینن و بیکوژن.

ئەمانە و دەیان ئەگەری تر کە هەرهەموویان عەقڵ تێی دەچوو رووبدەن.

تەنها شتێك ئومێدێکی بە دایکی مووسا بەخشیبوو، بەڵێنی خوا بوو کە بۆت دەگێڕینەوە

(وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِي إِنَّا رَادُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ الْمُرْسَلِينَ)، [١]

(نە بترستە و نەغەمیشت هەبێت، ئێمە دەیگێڕینەوە بۆت و دەشیکەین بە یەکێك لە پێغەمبەران).

خوای گەورە بەڵێنی دا ئەگەر دایکی مووسا گوێ بەو ئەگەرە مەترسیدارانە نەدات و فەرمانی خوا بەجێبگەیەنێت، هەم منداڵەکەی بۆ بگێڕێتەوە، هەم بیکات بە یەکێك لە پێغەمبەرانی خۆی.

---

(١) القصص: ٧.

ASTANA

به هەموو ئەم بەڵێنەشەوە، هێشتا ناخ و دڵی دایکی مووسا، یەکپارچە ترس و خەفەت و دوودڵی بوو، وەخت بوو هێز لە ئەژنۆی نەمێنێت و دڵی بپچڕێت ئەگەر رەحم و میهری خوا نەبوایە:

(وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَى فَارِغًا إِنْ كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِ لَوْلَا أَنْ رَبَطْنَا عَلَى قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ)،[١]

(ئەوسا دڵی دایکی مووسا هەستی بە بێتاقەتی کرد و لە هەموو شتێك خاڵیی بوو جگە لە باس و بیری مووسا، لەوانەبوو بیدرکێنێت و بڵێت ئەوە کوڕی منە ئەگەر ئێمە دڵیمان قایم نەکردایە تا لەوانە بێت کە بڕوایان بە بەڵێنی خوا هەیە).

ئەوەی دایکی مووسا لێی دەترسا هاتەدی، منداڵەکەی کەوتەبەردەستی خودی فیرعەون، ئیتر دەبێت لە روانگەی عەقڵیەوە چ هیوایەك بمێنێتەوە بۆ رزگاربوونی منداڵەکەی؟ ئەگەر پێشتر هیوایەك هەبوایە دڵی یەکێك لە سەربازەکان دوور لەچاوی فیرعەون بۆ کۆرپەیەك بسووتێت و فەرمانەکە جێبەجێ نەکات، ئەمجارەیان بێ ئەملاولا کۆرپەکەی کەوتۆتەبەردەستی ئەو کەسەی فەرمانەکەی دەرکردووە، کەسێك کە لەپێناو پاراستنی خۆی و ژیان و مان و دەسەڵاتیدا ئەو فەرمانەی دەکردووە، نەوەك لەبەر بەرژەوەندیەکی گشتی، یان لەپێناو دەستخۆشی ئەم و ئەو، بۆیە لە هەموو کەسێك سوورترە لەسەر جێبەجێکردنی فەرمانەکە، ئەویش خودی ئەو فیرعەونەیە کە خەوی بینیوە منداڵێکی لەو چەشنە لەدایك دەبێت و گەورە دەبێت و تەخت و تاراجی دەسەڵاتی لەبن دێنێت.

---

(١) القصص: ١٠.

دەبێت کاتێك ئەم هەواڵە گەیشتبێتەوە بە دایکی مووسا، چ هەستێکی لا دروست بووبێت، خۆ ئەگەر هەرکام لە ئێمەی ئیمان لاواز بووینایە، خێرا دەمانوت:

ئەمەبوو بەڵێنەکەی خوا؟!

ئەمەیە ئەو بەڵێنەی دەفەرمویێت سەرەنجام بۆ باوەردارانە؟!

ئەمە ئەو خوایە بوو کە دەیوت پشتم پێ ببەستن بەستانە؟!

بەڵام نابینین دایکی مووسا جگە لە خەفەتی ناو ناخی خۆی، هیچ گومانێکی خراپ و دەستەواژەیەکی دی بەکارهێنابێت، خوای گەورەش ئەو خەم و دوودڵیەی دایکی مووسای لەبەرچاوگرتووە وەك چۆن ئەوە بۆ هەر دایکێکی تر ئاساییە.

پاش ئەوەی دایکی مووسا هەتا کۆتا هەنگاوی ترس و دوودڵی، نافەرمانی خوای نەکرد و متمانەی بەرامبەر بە خوا کەمی نەکرد، ئینجا قۆناغ بە قۆناغ هاتنەدی بەڵێنی خوا دەستپێکرد، ئەویش گێڕانەوەی بوو بۆ نێو کۆشی دایکی، ئەویش بە سێ هۆکار:

(فَرَدَدْنَاهُ إِلَى أُمِّهِ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ)، [١]

(مووسامان گێڕایەوە لای دایکی بۆ ئەوەی چاوی رۆشن و دڵی فێنك ببێتەوەو خەفەت نەخوات، هەروەها بۆ ئەوەی بزانێت بەڵێنی خوا راستە).

**یەکەم:** بینایی دیدەی بێتەوەو دڵی ئۆقرە بگرێت و کۆتایی بە فرمێسکی خەفەتەکانی بێت.

---

(١) القصص: ١٣.

**دووەم:** ئیتر خەفەت نەخوات و لە پاداشتی ئەو بەهێزییەی ئیمانیدا، خەمەکانی بڕەوێنەوە.

**سێیەم:** هەتا دایکی مووسا چاك بزانێت بەڵێنی خوا حەقە و دێتەدی، با هەرچی لێکدانەوەی عەقڵیی هەیە وای بۆ بچێت هیوایەك نەماوە بۆ بەدیهاتنی بەڵێنەکە.

ئەو بێهیواییە حاڵەتێکە خوای گەورە تووشی باوەرداری دەکات بۆ ئەوەی بە تەواوەتی دڵ بەربدات لە توانا و ئەگەرە عەقڵی و مرۆییەکان و پاش بەکارهێنانی ئەو رێوشوێنە رەوایانەی خوای گەورە فێری کردووە، تەنها دڵی بە خوا بدات و هیوای بەو بمێنێت، بۆیە دەبینین پێغەمبەرانیش گەیشتوونەتە ئەو قۆناغەی بێهوایانە بڵێن (ئیتر ئەم سەرکەوتنەی خوا کەی دێت؟ )

(حَتَّى يَقُولَ الرَّسُولُ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ مَتَى نَصْرُ اللَّهِ)،[١]

(هەتا پێغەمبەر و ئەوانەشی لەگەڵیدا باوەڕیان هێنابوو دەیانوت: کەی سەرکەوتنی خوا دێت؟ ).

یەکەم هەنگاوی بەدیهاتنی بەڵێنەکە ئەوەبوو کە خوای گەورە خودی فیرعەون و خێزانەکەی کرد بە خزمەتکاری مووسا، وایلێکردن ئەمجار ئەوان هەوڵی مان و گەورەکردن و نازپێدانی مووسا بدەن، یەکەم هەنگاویش پەیداکردنی دایەنێك بوو بۆ ئەو منداڵەی پێشتر بە بڕیاری رەسمی پادشایەتی، بڕیاری کوشتنی بۆ درابوو.

---

(١) البقرة: ٢١٤.

ئینجا خوای گەورە شیری هەموو سەرزەویی لە مووسا حەرام کرد ﴿وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ الْمَرَاضِعَ مِنْ قَبْلُ﴾[١] (پێشتر هەرچی شیردەر هەیە لێیمان حەرام کرد)، ئەم حاڵەتە پێشتر بۆ کەس روویندابوو، روانگە عەقڵیەکە ئەوەیە بوترێت، ئەگەر شیری یەکێك نەخوات، مەمکی دایەنێکی تر ئەگرێت، ئەم نا ئەوی تر، دواجار دەبێت شیری دایەنێك بخوات، بەڵام خوا بەڵێنی داوەو بۆ بەڵێنەکەشی هۆکار دەسازێنێت ﴿وَآتَيْنَاهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا﴾،[٢] (لە هەموو شتێك کە پێویست بوو، هۆکار و ئامرازەکەیمان بۆ رەخساند).

بەم چەشنە هەموو ئەگەرەکان لەلایەن فیرعەونەوە تاقیکرایەوە هەتا گەیشتە سەر دایکی مووسا، ئەوکات کۆرپەکە مەمکی دایکی گرت.

ئەگەر ویستی خوا نەبوایە، ئەمەش دووبارە گەورەترین مەترسی بوو بۆ سەر ژیانی مووسا، چونکە ئەگەر پێشتر فیرعەون گومانێکی هەبوایە دەکرێت ئەم منداڵە بەنوئیسرائیلی نەبێت، ئەوا بە شیرخواردنی مووسا لای ئافرەتێکی بەنوئیسرائیلی ئەو گومانەش دەڕەوێتەوە، دەکرا گومان ببات ئەمە خودی دایکیەتی، بۆیە شیری ئەمیان دەخوات.

قۆناغی دووەمی بەدیهاتنی بەڵێنەکەش تەمەنێکی دەویست (دەیکەین بە یەکێك لە پێغەمبەران)، دواجار ئەو بەڵێنەش هاتەدی.

---

(١) القصص: ١٢.

(٢) الكهف: ٨٤.

ASTANA

## وێستگەی ٢

# ڕاکردنی مووسا



پاش ئەوەی مووسا لە ناو کۆشکی فیرعەوندا گەورەبوو و پێگەیەکی تایبەتی لە وڵاتدا وەرگرت، چونکە فیرعەون هیچ کوڕێکی نەبوو هەتا ببێتە جێگرەوەی، هیوایەك بوو بۆ هەموان هەتا فیرعەون لە وەجاخ کوێری دەربازی بێت، لەم سەروبەندەدا تاقیکردنەوەیەکی نوێی هاتەڕێ کە ئەگەری زۆری لەناوچوونی مووسای لێ دەخوێنرایەوە، ئەویش پشتیوانیکردنی کابرایەکی بەنوئیسرائیلی بوو کاتێك قیبتیەك ویستی ستەمی لێ بکات، مووساش بۆ گزێکی لێدا و بوویە هۆی کوشتنی کابرا، دواتریش دەستەکە ئاشکرا بوو و هەمان ئەو کەسەی مووسا هاوکاریی کرد، بوویە هۆکاری ئاشکراکردنی مووسا.

ئەم هەواڵە کە گەیشتەوە بە فیرعەون، ڕاستەوخۆ بڕیاری کوشتنی مووسا دەرکرا، چونکە هاوڵاتی پلەبەرزی نێو وڵاتی کوشتووە، ئەمەش بە هێڵی سوور تەماشا دەکرا، خۆ ئەگەر دە کەسی لە بەنوئیسرائیل بکوشتایە -کە هاوڵاتی پلە سێ بوون لە میصردا- سزا نەدەدرا.

بۆیە مووسا پێشوەختە خۆی سەرەنجامی ئەم کارەی دەزانی و پێش ئەوەی دەستەکەی ئاشکرا بێت، ترس دایگرت و بە ترسەوە هاتوچۆی دەکرد لە شاردا و گوێ قوڵاخی هەواڵ و قسەی ناو خەڵك بوو بزانێت

کەس هیچ ناڵێت (فَأَصْبَحَ فِي الْمَدِينَةِ خَائِفًا يَتَرَقَّبُ)،[١] (ترس و بیم مووسای داگرتبوو لەو شارەی پیاوەکەی تێدا کوشتبوو و چاوەڕوانی دەکرد).

ترسەکەشی لە جێی خۆی بوو، بۆیە کە دەستەکەی ئاشکرا بوو، بڕیاری فیرعەونیی لە بەرامبەر دەرکرا (بڕیاری کوشتنی مووسا).

لە روانگە عەقڵیەکەوە هیوایەك نەماوە بۆ مووسا، چونکە فیرعەون کەسێکی خاوەن بریار بوو، هەر بڕیارێکی دەربکردایە، دەبوو جێبەجێ بکرێت و بەهیچ جۆرێك کەمتەرخەمی تێدا نەکرێت، تەنها یەك جار بڕیاری خۆی بۆ مووسا جێبەجێ نەکردبوو کە ئەویش لەکاتی ساوایی و شیرخواردنیدا بوو، ئەگەرنا بەرامبەر کەسە نزیکەکانیشی بڕیار و یاساکانی جێبەجێ دەکرد، بۆیە دەبینین ئاسیەی ژنی خۆی کوشت و رەحمی پێ نەکرد، ئیتر دەبێت چ هیوایەك هەبێت بڕیاری کوشتنی مووسا جێبەجێ نەکرێت.

خوای گەورە هەمدی مووسای رزگار کرد، بۆ ئەمەش کەسێکی کرد بە هۆکار هەتا هەواڵەکە بگەیەنێتە مووسا

(وَجَاءَ رَجُلٌ مِنْ أَقْصَى الْمَدِينَةِ يَسْعَى قَالَ يَا مُوسَى إِنَّ الْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَاخْرُجْ إِنِّي لَكَ مِنَ النَّاصِحِينَ)،[٢]

(پیاوێك لەوپەڕی شارەوە بە هەڵەوداوان هات و وتی: ئەی مووسا، دەوروبەری فیرعەون دانیشتون و پیلان دادەنێن بۆت هەتا بتکوژن، دەسا لە شار دەرچۆ، چوون من لە دڵسۆزان و ئامۆژگاریکارانم بۆ تۆ).

---

(١) القصص: ١٨.

(٢) القصص: ٢٠.

ئەگەر لێکدانەوەی عەقڵیی بکرێت بۆ ئاوارەبوونی موسا، دەبوو ژیانێکی تاڵ و کولەمەرگی بهاتایەڕێ، چونکە:

مووسا لە کۆشکی فیرعەونیدا گەورە بووبوو و گەرمی و ساردی نەدیبوو، سەختی و ناخۆشیی نەچەشتبوو، ئێستا لەکتوپڕێکدا بە دەست و گیرفانی بەتاڵەوە ئاوارە دەبێت، هیوایەك نامێنێتەوە بۆی.

مووسا ترسی ئەوەی هەبوو نەتوانێت لەدەست سەربازانی فیرعەون دەرباز بێت و چاوەڕوان نەدەکرا بە سەلامەتی لە سنووری دەسەڵاتی فیرعەون دەربچێت، چونکە بڕیاری گرتن و کوشتنی فیرعەون دەرکرابوو و بڕیارەکەش گەیەنرابوویە سەرجەم یەکە سەربازییەکان، ئەگەریش لەو سنوورە دەربچوایە، هێشتا ترسی ئەوە هەبوو لەوێیش لە رێی پەیوەندییەکانەوە، مووسا بگەڕێنرێتەوە ژێر دەستی فیرعەون.

کەچی ویستی خوا شتێکی تر بوو:

مووسا لەبری فیرعەون، پەروەردەکارێکی تری دەستکەوت کە ئەویش پێغەمبەرێکی خوا بوو.

لەبری ئەوەی تەنها خواردنی بهێنرێتەبەردەست و هیچ فێر نەبێت، ئیش و پیشەیەکی دەستکەوت.

لەبری بێ ماڵ و حاڵی، کچە پێغەمبەرێکی بەهاوسەرگرت و خوای گەورە ماڵ و حاڵی پێ بەخشی.

﴿قَالَ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أُنْكِحَكَ إِحْدَى ابْنَتَيَّ هَاتَيْنِ عَلَى أَنْ تَأْجُرَنِي ثَمَانِيَ حِجَجٍ فَإِنْ أَتْمَمْتَ عَشْرًا فَمِنْ عِنْدِكَ وَمَا أُرِيدُ أَنْ أَشُقَّ عَلَيْكَ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ مِنَ

الصَّالِحِينَ، قَالَ ذَلِكَ بَيْنِي وَبَيْنَكَ أَيَّمَا الْأَجَلَيْنِ قَضَيْتُ فَلَا عُدْوَانَ عَلَيَّ وَاللَّهُ عَلَى مَا نَقُولُ وَكِيلٌ)،[١]

(وتی: دەمەوێت یەکێك لەم دوو کچەمت لێ مارە بکەم بەو شەرتەی هەشت ساڵ کارم بۆ بکەیت و مەڕەکانم بۆ بەخێو بکەیت، خۆ ئەگەر دەساڵ ئیشوکارم بۆ بکەیت، ئەوە چاکە و پیاوەتی خۆتە، ناشمەوێت زۆرت بۆ بهێنم و بارت قورس بکەم، ئەگەر خوا بیەوێت، زوو دەزانیت من قسەی خۆم بەجێ دێنم بە چاکەکار دەمبینیت، ئەویش وتی باشە، ئەوە بڕیارێك بێت لەنێوان من و تۆدا، ئەوکات هەوەسی خۆمە هەرکام لەو دوو ماوەیە جێبەجێ بکەم، خوای گەورەش وەکیل و بەئاگایە بەوەی کە ئەیڵێین).

(١) القصص: ٢٧.

## وێستگەی ٣

## ناردنی مووسا بۆ لای فیرعەون

کاتێك مووسا وادەی خۆی تەواو کرد و بە ژن و منداڵەوە ویستی بگەڕێتەوە نێو کەسوکاری، هیوای وابوو پاش دە ساڵ لە وڵاتدا باسوخواسەکە کۆتایی پێ هاتبێت و خەڵکێك نەبێت مووسا بناسێتەوە، بەڵکو بچێت لە کەنارێکەوە بە پەنهانی لای دایك و برا و کەسوکاری بژی.

لەم ساتەدا خوای گەورە فەرمانی پێ دەکات بچێت بۆ لای فیرعەون و بانگەوازی بکات بۆ دوو شت:

**یەکەم:** یەکخواپەرستیی و وازهێنان لە بانگەشەی خوایەتی، ئەمەش واتە دەستبردن بۆ پیرۆزییەکانی وڵاتی میصر، چونکە لەو وڵاتەدا فیرعەون وەك خواوەند تەماشا دەکرا و خەڵکیش ئەوەیان وەك بیروباوەڕ وەرگرتبوو، واتە مەسەلەکە بەزاندنی سنووری سەروەریی ئایینی وڵات میصر بوو.

**دووەم:** وازهێنان لە ستەم، واتە دەستبردن بۆ دەسترۆیی و صەلاحیاتی فیرعەون، بە واتایەکی تر کەمکردنەوەی سنووری دەسەڵاتی فیرعەون کە دەسەڵاتی باڵای میصر بوو، ئەو فیرعەونەی لە ترسی لەدەستدانی ئەو دەسەڵاتەی کە هەیبوو لەسەر بنەمای خەوێك هەزاران منداڵی

تازەلەدایکبووی کوشت، ئێستا کەسێك بچێت رووبەڕوو پێی بڵێت دەسەڵاتەکەت ستەمکارانەیە و دەبێت سنوورێك بۆ دەستڕۆییەکانت دابنرێت.

ئەم حاڵەتە ترسێکی لە دڵی مووسادا دروست کرد، بۆ ترسەکەشی بیانووی هەبوو و بیانووەکانیشی لە روانگەی عەقڵییەوە زۆر بەجێ بوون:

دەترسم بروام پێ نەکەن و بەدرۆزنم بزانن.

دەترسم لێم تێنەگەن، چونکە قسەکردنم رەوان نیە.

کاتی خۆی تاوانێکم کردووەو دەترسم بچمە بەدەستیان، لەسەر ئەو تاوانە بمکوژن.

(رَبِّ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يُكَذِّبُونِ، وَيَضِيقُ صَدْرِي وَلَا يَنْطَلِقُ لِسَانِي فَأَرْسِلْ إِلَى هَارُونَ، وَلَهُمْ عَلَيَّ ذَنْبٌ فَأَخَافُ أَنْ يَقْتُلُونِ)،[١]

(خوایە ئەترسم بە دۆرم بخەنەوەو بڕوام پێ نەکەن، سینە تەنگ بم و زمانم باش هەڵنەسووڕێت بۆ راگەیاندنی پەیامەکەم، جا پەیام بۆ هاروونی براشم بنێرە هەتا یارمەتیم بدات، بێگومان ئەوان تۆڵەی گوناهێکیان بەسەرمەوە هەیە، ئەترسم بەو بۆنەوە بمکوژنەوە).

هەموو ترسەکانیشی هاتنەرێی:

کاتێك چوویە لای فیرعەون و دارودەستەکەی، پێش فیرعەون، دەوروبەرەکەی بە درۆزنیان زانی و تۆمەتیان دایە پاڵی.

---

(١) الشعراء: ١٢-١٤.

﴿وَقَالَ الْمَلَأُ مِنْ قَوْمِ فِرْعَوْنَ أَتَذَرُ مُوسَى وَقَوْمَهُ لِيُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَيَذَرَكَ وَآلِهَتَكَ﴾،[١]

(پیاوە ناودارەکانی دەوری فیرعەون وتیان: ئاخۆ واز لە مووسا و گەلەکەی دێنیت هەتا بە ئازادانە دەست بکەن بە گەندەڵیی و گێرەشێوێنی و ئەم وڵاتە تێکبدەن و دەستهەڵگبرن لە پەرستنی خۆت و پەرستراوەکانت؟!).

خوای گەورە هاروونی کرد بە پشتیوانی بۆ ئەوەی کێشەی رەوانی قسەکردنی بۆ چارەسەر بکات.

هەرکە مووسا پەیامەکەی گەیاند بە فیرعەون، خێرا دۆسیەی کوشتنی کابرای لەسەر زیندوو کردەوە ﴿وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ﴾،[٢] (تۆ هەر ئەوە بوویت ئەو تاوانەت ئەنجامدا کە کردت).

ترسەکەش تەنها لای مووساوە نەبوو، بەڵکو هاروونیش هەمان دید و تێڕوانینی هەبوو، واتە پاش وتویژی نێوان هەردووڵا، گەیشتنە ئەوەی کۆمەڵێك مەترسی یەخەیان پێ دەگرێت.

﴿قَالَا رَبَّنَا إِنَّنَا نَخَافُ أَنْ يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَنْ يَطْغَى﴾،[٣]

(مووسا و هاروون وتیان: پەروەردگارا، ئەترسین فیرعەون لێمان پێش بکوێت و هەڵکوتێتە سەرمان و پێش ئەوەی راستیەکەی پێ بڵێین، سزامان بدات، یان یاخی ببێت).

---

(١) الأعراف: ١٢٧.

(٢) الشعراء: ١٩.

(٣) طه: ٤٥.

ASTANA

بەڵام ئەوەی گوڕ و تین و دڵنیایی بە مووسا دەبەخشی، بەڵێنی خوا بوو بۆ خۆی و هاروونی برای ﴿قَالَ لَا تَخَافَا إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَى﴾،[١] (خوا فەرمووی: مەترسن، بەڕاستی من لەگەڵ ئێوەم هەموو شتێك ئەبیستم و ئەبینم).

دواجار مووسا و هاروون بەو چەشنەی خوای گەورە فەرمانی پێکردبوون، هەموو ترس و ئەگەر و لێکدانەوە عەقڵییەکانی خۆیان وەلانا و هەمان ئەو ڕێکارانەیان گرتنەبەر کە خوای گەورە ڕێنمایی کردبوون و هەمان ئەو چەکەیان بەکارهێنا کە خوای گەورە پێی دابوون، ڕاستەوخۆ خۆیان گەیاندە بەردەم ناوەندی دەسەڵاتی میصر کە خودی فیرعەونە، چونکە دڵنیابوون خوای گەورە پشتیان بەرنادات.

بە هەموو پێوەرێکی عەقڵیی دەبوو بڕیاری کوشتنی مووسا یەکەم بابەت بێت قسەی لەسەر بکرێت، بەتایبەت کە مووسا لەدەست یاسا رایکردبوو و ئەوەش بووبوو بە دۆسیەیەکی تر بۆی، پاشان دەستبردن بۆ پیرۆزییەکانی گەل و وڵاتێك دووەم تۆمەت بوو کە دەکرا ڕاستەوخۆ سزای مووسا و هاروونی پێ بدرێت.

بەڵام ئەنجامەکە شتێکی تر دەرچوو، فیرعەون لە هەڵوێستی هێرشەوە، پاشەکشەی کرد بۆ هەڵوێستی بەرگریکردن، ئەمجار داوای بەڵگەی پێغەمبەرایەتیی لە مووسا دەکرد، موناقەشەی بوونی خوایەکی جگە لە خۆی دەکرد، وادەی ململانێی ئاشکرای لەگەڵ مووسا دادەنا و بۆ ئەوەش کەوتە کۆکردنەوەی جادووگەرەکانی وڵات هەتا ڕاستی پێغەمبەرایەتیی مووسای پێ بشکێنێت، دواجاریش بە شکستی فیرعەون و سەرکەوتنی مووسا کۆتایی هات.

---

(١) طه: ٤٦.

## وێستگەی ٤

## باوەڕهێنان بە ڕەزامەندی و لە ناچاریدا

کاتێك مووسا پەیامی خوای گەیاند و بەڵگەی پێویستیشی لەوبارەوە خستەڕوو، دابەشبوونێك لە کۆمەڵگەی میصریدا دروست بوو، دەستەیەك کە زۆرینەیان بەنوئیسرائیلی بوون باوەڕیان پێهێنا، زۆرینەیەکیش کە زۆربەیان قیبتی و هەوادارانی فیرعەون بوون، باوەڕیان نەهێنا و کەوتنەدژایەتیکردنی بانگەوازەکە، بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە، جیاوازی باوەڕی جادووگەرەکانی فیرعەونە، لەگەڵ بەڵێنی باوەرهێنانی فیرعەون و داروەستەکەی و پاشگەزبوونەوەیان.

**یەکەم:** کاتێك وادەی ڕۆژی ململانێی نێوان مووسا و جادووگەرەکانی فیرعەون دانرا کە بە یوم الزینە ناسرابوو، هەموو ئەگەرەکان بۆ ئەوە دەچوون سەختترین دژایەتیی بانگەوازەکەی مووسا لەو ڕۆژەدا بێت، چونکە جادووگەرەکان لەسەر ئاستی توانا و لێهاتوویی هەڵبژێردرابوون و بەڵێنی گەورەشیان پێ درابوو.

﴿وَابْعَثْ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ، يَأْتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٍ، فَجُمِعَ السَّحَرَةُ لِمِيقَاتِ يَوْمٍ مَعْلُومٍ، وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلْ أَنْتُمْ مُجْتَمِعُونَ، لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ السَّحَرَةَ إِنْ كَانُوا هُمُ الْغَالِبِينَ، فَلَمَّا جَاءَ السَّحَرَةُ قَالُوا لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِنْ كُنَّا نَحْنُ الْغَالِبِينَ، قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَمِنَ الْمُقَرَّبِينَ﴾،[١]

---

(١) الأعراف: ١١١ - ١١٤.

ASTANA

(سەربازان بنێرە بۆ هەموو شارەکان، با جادووگەرانت بۆ کۆبکەنەوە، هەرچی جادووگەرێکی کارامە و زۆرزانە بۆت بهێنن، جادووگەرەکان لە رۆژێکی دیاریکراودا کۆکرانەوە، بە خەڵکەکەش وترا: ئاخۆ ئێوەش کۆدەبنەوە؟ ئەگەر ئەم جادووگەرانە براوەبوون، لەوانەیە ئێمەش پەیڕەوییان لێ بکەین، ئینجا جادووگەرەکان کە هاتنە بەرەوە، بە فیرعەونیان وت: ئەگەر ئێمە سەرکەوتین، ئایا پاداشتمان بۆ هەیە؟ فیرعەونیش وتی: بەڵێ، بێگومان لە کەسە نزیکەکانی خۆشم دەبن).

ئەزموونی نکووڵیکردن سەرەڕای زانینی راستیەکان، باوێکی ناو ستافی فیرعەون و پشتیوانانی بوو، وەك قورئانی پیرۆز باسی دەکات (وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنْفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا)،[١]

(لەناخەوە متمانە و دڵنیاییان هەبوو پێی، بەڵام نکووڵییان لێدەکرد لە رووی ستەمکاری و خۆبەزلزانینەوە).

بۆیە دەبوو سەرسەختترین نەیارەکانی مووسا جادووگەرەکان بوونایە و هیچ هیوایەك نەبوایە بۆ موسڵمانبوونیان، بەڵکو هیوایەکی باوەڕهێنان بەو خەڵکە بوو کە هاتبوون بۆ بینینی حاڵەتەکە و لە دەرەوەی بازنەی ململانێکەدا بوون، کەچی پاش ئەوەی جادووگەرەکان ئەزموونی خۆیان تاقیکردەوەو پاشان موعجیزەکەی مووسایان بینی، بێ دوودڵیی باوەڕیان هێنا، ئەویش چ باوەڕهێنانێك، ئامادەبوون یەکسەر لەپێناویدا گیانی خۆیان بەخت بکەن.

(قَالَ فِرْعَوْنُ آمَنْتُمْ بِهِ قَبْلَ أَنْ آذَنَ لَكُمْ إِنَّ هَذَا لَمَكْرٌ مَكَرْتُمُوهُ فِي الْمَدِينَةِ لِتُخْرِجُوا مِنْهَا أَهْلَهَا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ، لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ مِنْ

---

(١) النمل: ١٤.

خِلَافٍ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ، قَالُوا إِنَّا إِلَى رَبِّنَا مُنْقَلِبُونَ، وَمَا تَنْقِمُ مِنَّا إِلَّا أَنْ آَمَنَّا بِآَيَاتِ رَبِّنَا لَمَّا جَاءَتْنَا)،[١]

(فیرعەون وتی: چۆن پێش ئەوەی من مۆڵەتتان پێ بدەم باوەڕتان پێ هێنا،بێگومان ئەم کارەی ئێوە پیلانێکە بەرلەوە بێنە ئەم گۆڕەپانەوە لە شاردا سازاندووتانە هەتا هاوەڵە قیبتیەکانی لێدەرپەڕێنن و لەبری ئەوە هۆزەکەی خۆتانی تێدا نیشتەجێ بکەن، لەمەودوا چاك دەزانن چیتان پێ ئەکەم، دڵنیابن دەستی ڕاست و پێی چەپتان ئەبڕم و هەمووشتان لە خاچ دەدەم، جادووگەرەکانیش وتیان: گرنگ نیە، چون ئێمە هەر بۆ لای پەروەردگارمان دەچینەوە، دیارە تۆیش هەر لەبەر ئەمە ئازارمان دەدەیت و رقت لێمان هەڵگرتووە کە بڕوامان بە ئایەت و بەڵگەکانی پەروەردگارمان هێناوە).

لە بەرامبەر ئەمەدا هەڵوێستی فیرعەون و دارودەستەکەی دەبینین کە کاتێك خوای گەورە بە چەند چەشنێك سزایان دەدات، بەڵێن دەدەن ئەگەر خوای گەورە سزاکانیان لەسەر هەڵگرێت باوەڕ دەهێنن،

(فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ آَيَاتٍ مُفَصَّلَاتٍ فَاسْتَكْبَرُوا وَكَانُوا قَوْمًا مُجْرِمِينَ، وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ الرِّجْزُ قَالُوا يَا مُوسَى ادْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِنْدَكَ لَئِنْ كَشَفْتَ عَنَّا الرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ الرِّجْزَ إِلَى أَجَلٍ هُمْ بَالِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنْكُثُونَ)،[٢]

(ئێمەش بارانێکی بە لێزەمە و بە تۆفان و کوللەمان ناردە سەریان بۆ لەناوبردنی خۆیان و فەوتاندنی کشتوکاڵ و مەرزاکانیان، سوونیشمان

---

(١) الأعراف: ١٢٣-١٢٦.

(٢) الأعراف: ١٣٣-١٣٥.

نارده سەریان، بۆقیشمان نارده سەر کاسە و کەوڵیان، خوێنمان کرده سزایان، گشت ئەمانە ئایەت و نیشانەی روون و لێکجیا بوون، کەچی دەعیە و فیز گرتنی و ئیمانیان نەهێنا، لە بنەڕەتدا گەلێکی تاوانکار بوون، هەرکە ئەو سزایە هاتە سەریان و بەچاو دیتیان، وتیان ئەی مووسا! لە پەروەردگارت بخوازە لەبەر پەیمانێك کە لەگەڵ تۆدا کردوویەتی، دڵنیابە ئەگەر ئەو سزایەت لەسەر لابردین، مەرج بێت باوەڕت پێ بهێنین و نەوەکانی یەعقووبیشت لەگەڵ بنێرین).

بە پێوەری عەقڵیی، ئەگەری موسڵمانبوونی ئەو خەڵکە زۆر نزیك لەوەی بێتەدی، چونکە ئیتر بەهۆی ئەو سزا هەمەچەشنانەوە، لاوازی خۆیان و هێز و دەسەڵاتی پەروەردگاریان بۆ دەرکەوت و دەبوو ئەوە ببێتە مایەی باوەڕهێنانیان، وەك چۆن ئەگەر لەم سەردەمەدا نەخۆشی و بەڵا و کارەساتێك رووبدات و لاوازی مرۆڤایەتی نیشان بدات، هەموان چاوەڕێی ئەوەین شەپۆلی موسڵمانبوونی خەڵك بەدیبکەین، هەمان حاڵەت بە زەقتر و روونتر لەو سەردەمەدا هەبوو، کەچی هەرچەندە بە رەسمیش بەڵێنیان دەدا باوەڕبهێنن، بەڵام دواتر پاشگەز دەبوونەوە لە بەڵێنەکەیان.

ASTANA

## وێستگەی ٥

# خنکانی فیرعەون و سوپاکەی

پاش ئەو هەموو بەریەککەوتنەی نێوان باوەڕداران و فیرعەون و داروودەستەکەی، دوای ئەوەی هیوایەك نەما بۆ باوەڕهێنانی فیرعەون و سوپاکەی، مووسا راسپێردرا کە بەنوئیسرائیل و باوەڕداران لەژێر دەسەڵاتی فیرعەون دەربکات و وڵات جێبهێڵن، ئەمەیە یەکێك بوو لە داواکاریەکانی مووسا ﴿أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾،[١] (بەنوئیسرائیلمان لەگەڵدا بنێرە)، چونکە فیرعەون مافی چوونەدەرەوە لە وڵاتی لە بەنوئیسرائیل زەوتکردبوو، بەڵام کاتێك سزای خوایی فیرعەون و بێباوەڕانی گرتەوە، بەڵێنی دا ئەگەر سزاکەیان لەسەر هەڵبگیرێت، دەرفەت بدات بەنوئیسرائیل لەگەڵ مووسادا بنێرێت ﴿وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾،[٢] (دڵنیابە بەنوئیسرائیلت لەگەڵ دەنێرین)، کەچی پاش هەڵگیرانی سزاکان، بەڵێنەکەی نەبردەسەر.

بەهەرحاڵ فیرعەون بریاری دەرکرد هێرش بکرێتە سەر باوەڕداران و لەناوببرێن، پێشوەختەش خوای گەورە فەرمانی کرد بە مووسا، هاودەم بە بەنوئیسرائیل وڵات جێبهێڵن، چونکە زۆر ناخایەنێت دەدەن

---

(١) الشعراء: ١٧.

(٢) الأعراف: ١٣٤.

بەسەریاندا (وَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي إِنَّكُمْ مُتَّبَعُونَ)،[1] (سروشمان بۆ مووسا نارد کە بە شەو بەندەکانم بەرەو دەریا ببە، چونکە دوژمنان تاقیبتان ئەکەن و دواتان دەکەون).

لەولاشەوە فیرعەون ڕێنمایی تایبەت بەو بوارەی دەرکرد، لە سەرجەم ناوچەکاندا بەیاننامەی ڕەسمیی فیرعەون بخوێنرێتەوە کە ئەمانەی لەخۆدەگرت:

دارودەستەی مووسا کەمینەیەکی ناو وڵاتن و بوونەتە مایەی بێزاریی و سەرئێشە بۆمان.

هەموان هۆشیارییەکی تەواومان هەیە بەرامبەر بە مەترسی ئەوان و هەنگاوی پێویستمان بۆ ناوە و ئەوان هیچ نین و بە ئاسانی بەسەریاندا سەردەکەوین.

دەبێت هێرشیان بکرێتەسەر و پێش ئەوەی لە وڵات دەربچن، بدرێت بەسەریاندا و لەناوببرێن.

(فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِي الْمَدَائِنِ حَاشِرِينَ، إِنَّ هَؤُلَاءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ، وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَائِظُونَ، وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَاذِرُونَ)،[2]

(فیرعەون کۆکەرەوەکانی بەشارەکاندا نارد بۆ کۆکردنەوەی سوپا، جاڕی دا و وتی: بێگومانە ئەوانە دەستە و کۆمەڵێکی کەمن، ئەوانە ئێمەیان تووڕە و قەڵس کردووە، ئێمە کۆمەڵێکی ئاگادار و وریاین).

---

(١) الشعراء: ٥٢.

(٢) الشعراء: ٥٣- ٥٥.

ئەوەبوو سوپایەکی گەورەی فیرعەونیی کەوتنە شوێن مووسا و شوێنکەوتەکانی هەتا گەیشتنە کەنار نیل و ڕێی دەرچوون نەما، کەشێکی لەم چەشنە دروست بوو:

ژمارەیەکی دیاریکراوی شوێنکەوتەی مووسا بە ژن و منداڵەوە، بێ چەك، بێ ئەوەی هیچ ئەزموونێکی جەنگییان هەبێت، ترسێنراو و چەوسێنراوەی چەندین ساڵەی ژێر دەسەڵاتی فیرعەون، کەوتوونەتە بۆسەیەکەوە، بەردەمیان دەریایە، چواردەوریشیان سوپایەکی گەورەی هێرشبەرە.

سوپای ملیۆنیی پڕچەکی فیرعەونی کە ساڵەهای ساڵە ڕاهێنراون لەسەر کوشت وبڕ و هونەری جەنگی، لەوپەڕی بەهێزیدا هاتون بۆ هێرشبردنە سەر کۆمەڵێك کەسی بێ چەکی چەوساوە کە هیچ چەکێکیان پێ نیە.

بۆیە شوێنکەوتووەکانی مووسا هەرچی بە عەقڵ و واقیع لێکیاندەدایەوە، هیوایەك نەمابوو بۆ دەربازبوونیان، ڕاشکاوانە ئەم ترسەیان دەردەبڕی و دەیانوت (إِنَّا لَمُدْرَكُونَ)[١] وا گەیشتوونەتە لامان و دەستیان گەیشتۆتە ئێمە.

بەڵام مووسا کە پێشتر ژیانی سەراپا ئەو ئەزموونانەیە کە خوای گەورە فریای کەوتووەو پێوەرە عەقڵیەکان یەکلاکەرەوە نەبون لە سەرجەم بابەتەکاندا، بێ دوودڵیی دەفەرموێت (كَلَّا إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ)،[٢] (نەخێر، من پەروەردگارێکم لەگەڵە کە بە زوویی ڕێنموونیم دەکات).

---

(١) الشعراء: ٦١.

(٢) الشعراء: ٦٢.

چونکە مووسا دەیزانی کاتێك خوای گەورە فەرمانی پێکردووە وڵات جێبهێڵن، لە نیوەی ڕێدا جێیان ناهێڵێت، یەکەمجار کە ناردی بۆ لای فیرعەون، بەڵێنی پێدا هاودەم بە خۆت و هاروون دەبیستم و دەبینم و بە تەنها جێتان ناهێڵم، ئێستا پاش بەرهەمهاتنی بانگەوازەکە، چۆن خوای گەورە ویڵیان دەکات.

راستیی دڵنیاییەکەی مووساش هاتەدی و خوای گەورە دەریای بۆ کەرتکردن و موسڵمانان دەربازبوون و فیرعەون و دارودەستەکەشی خنکان، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ئەوانەی لە دیدی عەقڵیەوە دەبوو لەناوبچن، رزگار بوون، ئەوانەش کە بڕیار بوو تەپڵی سەرکەوتن لێ بدەن، خنکان و لەناوچوون.

(فَأَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنِ اضْرِبْ بِعَصَاكَ الْبَحْرَ فَانْفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ، وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ الْآخَرِينَ، وَأَنْجَيْنَا مُوسَى وَمَنْ مَعَهُ أَجْمَعِينَ، ثُمَّ أَغْرَقْنَا الْآخَرِينَ)،[١]

(نیگامان بۆ مووسا نارد کە بە داردەستەکەت لە دەریا بدە، کە لێیدا دەریا قڵیشا و هەر لایەکی وەك کێوێکی گەورەی لێهات، فیرعەون و لەشکرەکەیشیمان نزیك بە دەریاخستنەوە و هاتن بەدوایاندا، مووسا و سەرجەم ئەوانەی لەگەڵیدا بوون، رزگارمان کردن و پەڕینەوە، ئەوانی تریش -کە فیرعەون و دارودەستەکەی بوو- نوقممان کردن و خنکان).

---

(١) الشعراء: ٦٣-٦٦.

ASTANA

# وێستگەی ٦

## دیداری مووسا و خزر

یەکێکی تر لە وێستگەکانی نێو ژیانی پێغەمبەر مووسا، گەیشتنیەتی بە کەسایەتیەك بەناوی (خَضِر)[١] خزر کە ناوی خدری کوردەواریش لەو ناوەوە وەرگیراوە، هۆکاری بەیەکگەیشتنەکەشیان، بە ویست و فەرمانی خوا بوو، بۆ ئەوەی پێغەمبەر مووسا تێبگات کە زاناترینی سەرزەوی نیە، هەروەها چەند وانەیەك لەو کەسایەتیەوە فێر ببێت سەبارەت بە جیاوازی دیوی رووکەش و دیوی شاراوەی هەر رووداو و پێشهاتێك.

لە فەرموودەیەکدا کە ئیبن عەبباس دەیگێڕێتەوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت (بَيْنَمَا مُوسَى فِي مَلَإٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: هَلْ تَعْلَمُ أَحَدًا أَعْلَمَ مِنْكَ؟ قَالَ مُوسَى: لَا. فَأَوْحَى اللهُ إِلَى مُوسَى: بَلَى ، عَبْدُنَا خَضِرٌ . فَسَأَلَ مُوسَى السَّبِيلَ إِلَيْهِ ، فَجَعَلَ اللهُ لَهُ الْحُوتَ آيَةً ، وَقِيلَ لَهُ: إِذَا فَقَدْتَ الْحُوتَ فَارْجِعْ ، فَإِنَّكَ سَتَلْقَاهُ، وَكَانَ يَتَّبِعُ أَثَرَ الْحُوتِ فِي الْبَحْرِ، فَقَالَ لِمُوسَى فَتَاهُ: { أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي

---

(١) راوبۆچوونی جیاواز هەیە سەبارەت بەوەی ئایا ئەم کەسایەتیە پێغەمبەری خوایە، یان بەندەیەکی خوا بووەو پێغەمبەرایەتی پێ نەبەخشراوە، هەندێك لە زانایان بەڵگە دەهێننەوە لەسەرئەوەی پێغەمبەر بووە، هەندێکی تریش پێیان وایە پێغەمبەر نەبووە.

ASTANA

نَسِيتُ الْحُوتَ وَمَا أَنْسَانِيهُ إِلا الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ } { قَالَ ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِي فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا } فَوَجَدَا خَضِرًا)،[١]

(جارێك مووسا لەنێو دەستەیەك لە خەڵكی بەنوئیسرائیلدا بوو، لەو سەروبەندەدا پیاوێك هات بۆ لای و پێی وت: ئەریٚ تۆ کەسێك شك ئەبەیت لەخۆت زاناتر بێت؟ مووسایش فەرمووی: نەخێر، ئەوەبوو خوای گەورە نیگای دابەزاندە خوارەوە بۆ سەر مووسا و فەرمووی: با، خزری بەندەمان، ئینجا مووسا داوای کرد ڕێی گەیشتن بەو بەندەی پیٚ نیشان بدرێت، خوای گەورە ماسیی کردە نیشانە بۆ گەیشتن پێی، پێی وت: ئەگەر ماسییەکەت ونکرد، ئەوە بگەڕێرەوە، چونکە ئەوکات پێی دەگەیت، مووسایش لەو دەریایەدا بەدوای شوێنەوار و دەرکەوتنی ئەو حووتەوە بوو، ئەوەبوو هاوەڵەکەی پێی وت: ئەریٚ دەزانیت چی ڕوویدا؟ ئەو کاتەی چووینە پەنا بەردە گەورەکە و پشوومان دەدا، من ماسیەکەم بیرچوو، دیارە هەر شەیتانیش بوو لەبیری بردمەوە بۆتی بگێڕمەوە، مووساش فەرمووی: ئێمەش هەر شتێکی وامان دەویست، ئینجا بەچاوگێڕان بە ڕێی خۆیاندا گەڕانەوە بۆ ئەو شوێنەی بەجێیان هێشتبوو، لەویٚ خزریان بەدیکرد).

بەم چەشنە بەیەکگەیشتنی نێوان مووسا و خزر هاتەدی، بەیەکگەیشتنێك کە سەرەتاکەی بە یەکترناسین دەستی پێکرد، واتە ئەوە نەبێت خزر نەزانێت ئەم کەسەی هاتووە بۆ لای، پێغەمبەرێکی خوایە، بەڵکو وەك لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە (فَسَلَّمَ عَلَيْهِ مُوسَى فَكَشَفَ عَنْ وَجْهِهِ، وَقَالَ: هَلْ بِأَرْضِي مِنْ سَلَامٍ ، مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: أَنَا مُوسَى، قَالَ: مُوسَى بَنِي إِسْرَائِيلَ؟ قَالَ: نَعَمْ ، قَالَ: فَمَا شَأْنُكَ؟ قَالَ: جِئْتُ لِتُعَلِّمَنِي

---

(١) صحيح البخاري، كتاب العلم، رقم الحديث ٧٤.

مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ، قَالَ: أَمَا يَكْفِيكَ أَنَّ التَّوْرَاةَ بِيَدَيْكَ ، وَأَنَّ الْوَحْيَ يَأْتِيكَ؟ يَا مُوسَى، إِنَّ لِي عِلْمًا لَا يَنْبَغِي لَكَ أَنْ تَعْلَمَهُ ، وَإِنَّ لَكَ عِلْمًا لَا يَنْبَغِي لِي أَنْ أَعْلَمَهُ، فَأَخَذَ طَائِرٌ بِمِنْقَارِهِ مِنَ الْبَحْرِ ، وَقَالَ: وَاللهِ مَا عِلْمِي وَمَا عِلْمُكَ فِي جَنْبِ عِلْمِ اللهِ، إِلَّا كَمَا أَخَذَ هَذَا الطَّائِرُ بِمِنْقَارِهِ مِنَ الْبَحْرِ)،[١] (مووسا کە خزری بینی، سەلامی لێکرد، ئەویش جلەکەی سەر دەموچاوی لابرد -چونکە راکشابوو- وتی لەم ناوچەی مندا و سەلام؟ ناوت چیە؟ فەرمووی: من مووسام، خزر وتی: مووسای بەنی ئیسرائیل؟ فەرمووی: بەڵێ، خزر پرسی خێرە؟ ئەویش فەرمووی: هاتوم هەتا لەو زانستەی رێنموونی کراویت و فێریکراویت، شتێکت لەلا فێر ببم، ئەویش وتی: یانی ئەوەندەت بەس نیە کە تەوراتت لەبەردەستە و نیگات بۆ دادەبەزێت؟ ئەی مووسا، من زانستێکم لایە کە جێی خۆی نیە تۆ فێری ببیت، تۆیش زانستێکت لایە کە جێی خۆی نیە من فێری ببم، ئینجا لەو کاتەدا باڵندەیەك بە دەنووکی شتێکی لە دەریادا برد، خزر وتی: سوێند بەخوا زانستی من و زانستی تۆیش لەپاڵ زانستی خوادا هەروەك ئەو کەمە شتەیە کە ئەو باڵندەیە بە دەنووکی لە دەریای برد).

پاشان مەرجی هاورێیەتی لەنێوانیاندا دانرا، مەرجەکەش جێبەجێ کرا و بوویە هۆکاری لێکجیابوونەوەیان.

خزر بەندەیەکی خوایە کە لەلایەن خوای گەورەوە رەحمەت و زانیارییەکی لەدونی پێ بەخشراوە.

مووسایش پێغەمبەرێکی ئولولعەزمە، کە خوای گەورە لەبارەیەوە دەفەرمویێت: (وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي).

---

(١) صحيح البخاري، كتاب تفسير القرآن، الرقم ٤٧٢٦.

داواکاریی مووسا پێغەمبەر بۆ بەندەیەکی ئەوەبوو کە دەتوانم هاوەڵیت بکەم بۆ ئەوەی برێك شتت لێوە فێر ببم؟ خزر بەهۆی ئەو ئەزموونەی پێشتر کە هەیبوو و خەڵکی نەیاندەتوانی لێی تێبگەن، وەڵامی بۆ مووسا پێغەمبەریش ئەوەبوو کە تۆ هەرگیز ناتوانیت لەگەڵ مندا خۆت رابگریت، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە زانیاریت نیە بەو شتانەی روودەدەن، بەڵام مووسا پێغەمبەر بەڵێنی دا خۆڕاگر بێت و ئەزموونی خۆڕاگریی لێ ببینرێت، مەرجی خزریش ئەوەبوو ئەگەر هاوەڵیم بکەیت، نابێت پرسیاری هیچ شتێکم لێ بکەیت تا ئەو کاتەی خۆم روونکردنەوەت پێ دەدەم، مووسایش بەمە رازیی بوو، کەچی لە یەکەم هەنگاودا نەیتوانی پابەندی بێت، بەڵام خزر هەتا سێ هەنگاو مۆڵەتی مانەوەی هاورێیەتیەکەی پێدا.

(فَوَجَدَا عَبْدًا مِنْ عِبَادِنَا آتَيْنَاهُ رَحْمَةً مِنْ عِنْدِنَا وَعَلَّمْنَاهُ مِنْ لَدُنَّا عِلْمًا، قَالَ لَهُ مُوسَى هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَى أَنْ تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا، قَالَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا، وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَى مَا لَمْ تُحِطْ بِهِ خُبْرًا، قَالَ سَتَجِدُنِي إِنْ شَاءَ اللَّهُ صَابِرًا وَلَا أَعْصِي لَكَ أَمْرًا، قَالَ فَإِنِ اتَّبَعْتَنِي فَلَا تَسْأَلْنِي عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا، فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا رَكِبَا فِي السَّفِينَةِ خَرَقَهَا قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا إِمْرًا، قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا، قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا، فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا لَقِيَا غُلَامًا فَقَتَلَهُ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةً بِغَيْرِ نَفْسٍ لَقَدْ جِئْتَ شَيْئًا نُكْرًا، قَالَ أَلَمْ أَقُلْ لَكَ إِنَّكَ لَنْ تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا، قَالَ إِنْ سَأَلْتُكَ عَنْ شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَاحِبْنِي قَدْ بَلَغْتَ مِنْ لَدُنِّي عُذْرًا، فَانْطَلَقَا حَتَّى إِذَا أَتَيَا أَهْلَ قَرْيَةٍ اسْتَطْعَمَا أَهْلَهَا فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَنْ يَنْقَضَّ فَأَقَامَهُ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَاتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا)، [١]

---

(١) الكهف: ٦٥-٧٧.

(بەندەیەك لە بەندەکانی ئێمەیان بەدیکرد کە لە بەزەیی و میهرەبانی خۆمان بەهرەدارمان کردبوو و زانست و زانیاریی تایبەتیشمان لە خۆمانەوە فێرکردبوو، مووسا پێی گوت: ئاخۆ مۆڵەتم دەدەیت بەردەوام لەگەڵت بم تا لەو زانستەی فێرکراویت منیش فێر بکەیت بەڵکو کەڵکی لێوەربگرم؟ ئەویش وتی: بەراستی تۆ هەرگیز لەگەڵ من هەڵناکەیت و ناتوانیت خۆڕاگر بیت، چۆن دەر دەبەیت لە ئاست شتێکدا کە ئاگات لە بنج و بنەوانی نیە؟! مووسا وتی: پشت بەخوا دەمبینیت خۆڕاگر دەبم و لە هیچ فەرمانێکت سەرپێچی ناکەم، ئەویش وتی: ئەگەر قبووڵتە بەدوامدا بێیت، ئەوە لە حیکمەتی هیچ شتێك پرسیارم لێ مەکە هەتا کاتی خۆی خۆم قسەت بۆ دەکەم و لە نهێنییەکەی ئاگادارت دەکەم، ئینجا هەردوو پێکەوە ڕۆیشتن تا کاتێ سواری کەشتیەکە بوون، خزر کونی تێکردو عەیبداری کرد، مووسا خۆی پێنەگیراو بەسەرسوڕمانێکەوە وتی: ئاخۆ تۆ ئەم کەشتییە کون دەکەیت، هەتا هەموو سەرنشینەکانی نقوم کەیت؟! بەڕاستی کارێکی بەدفەڕوو ناشایستەت کرد، خزر گوتی: مەگەر پێشتر پێمنەگوتی تۆ هەرگیز ناتوانی لەگەڵ من خۆ ڕابگریت، مووسا گوتی: لەمە لەبیرم چوو لێم مەگرە، وە لە فێربوونی ئەو زانیارییەدا کە دەمەوێ لەتۆوە فێربم، سەختگیریم لەگەڵ مەکە، پاشان لەکەشتییەکە دابەزین و ڕۆیشتن تا لەڕێگەدا بەکوڕێکی تازەلاو گەیشتن و خدر کوشتیی!! مووسا وتی: سەیرە! ئایا کەسێکی پاکی بێ گوناهت کوشت، بێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێت؟! بەڕاستی کارێکی زۆر گەورەی ناپەسەندت ئەنجامدا، خزر وتی: ئەی پێم نەگوتی هەرگیز تۆ ناتوانی لەگەڵ من ئارام بگری و هەڵبکەیت؟ مووسا وتی دەسا ئەگەر دوای ئەمە جارێکی

تر پرسیاری هەرشتێکم لێکردی و رەخنەم لێگرتیت، ئیتر هاورێیەتیم مەکە، ئیتر بەڕاستی مافی خۆتە و لەلایەن منیشەوە بیانووی جیابوونەوەت دەست کەوتووە، منیش گلەیی و بیانووم نامێنێ، هەردوو پێکەوە رۆیشتن تا گەیشتنە خەڵکی شارێك، داوای خۆراك و خواردەمەنیان لێکردن، هەروەك میوانێك رووبکاتە جێگایەك و برسی بێت، ئەوانیش میوانداریيان نەکردن، چونکە خەڵکێکی رژد وچرووك و پیسکە بوون، جا دیوارێکیان لەوێ بەدی کرد خەریك بوو بکەوێ، خزر هەڵی چنیەوەو راستیکردەوە، مووسا وتی: ئەگەر ئارەزووت بووبا بۆ چاککردنەوەی ئەو دیوارە کرێیەت وەرئەگرت).

ئەگەر تێبینی ئەم سێ رووداوە بکەین، لە هەر سێ حاڵەتەکەدا لێکدانەوەی عەقڵیی و واقیعی مووسا پێغەمبەر زۆر ورد و جوانە، هەر پێوەرێکی عەقڵی تریش بەکاربهێنرایە، هەمان خوێندنەوەی بۆ رووداوەکان دەکرد، کەچی لەو سێ رووداوەدا حەق لای خزر بوو نەوەك لێکدانەوەکانی مووسا پێغەمبەر، چونکە خزر لەودیو سنووری عەقڵەوە سەبارەت بە رووداوگەلێك لەلایەن پەروەردگاریەوە زانیاریی پێ بەخشرابوو، بۆیە پێش ماڵئاوایی، بۆ ئەوەی هیچ گومانێك لەدڵی مووسادا چەکەرە نەکات، خزر روونکردنەوەی پێویستی پێدا و تێیگەیاند لەودیو سنووری عەقڵ و بینراو و بەرچاوەوە، هەندێك زانیاریی هەن کە مرۆڤ درکیان پێ ناکات، ئەمەشی لەخۆوە نەکردووە، بەڵکو ئەوە لە دەرەوەی سنووری مرۆڤە و خوای گەورە رێنمونی کردووە، هەرچەندە مووسا پێغەمبەر خۆیشی هەمان شتی ئەزموونکردبوو، وەك رووداوی موعجیزەکانی و پەڕینەوەی لە دەریا و دوانزە کانیاوەکە و .. هتد کە لە سنووری توانا و عەقڵ و قەناعەتی مرۆڤدا نەبوون، بەڵام

هێشتا هەندێك ئەزموونی جیاواز هەبوون کە دەبوو بیانبینێت، خوای گەورەش لە ڕێی خزرەوە ئەو ئەزموونەی پێ نیشان دا.

ڕوونکردنەوەکەی خزر بۆ هەر سێ ڕووداوەکە بەم چەشنە بوو:

(قَالَ هَذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا، أَمَّا السَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَاكِينَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ فَأَرَدْتُ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَاءَهُمْ مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا، وَأَمَّا الْغُلَامُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَا أَنْ يُرْهِقَهُمَا طُغْيَانًا وَكُفْرًا، فَأَرَدْنَا أَنْ يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِنْهُ زَكَاةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا، وَأَمَّا الْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَامَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِي الْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُ كَنْزٌ لَهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَالِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَنْ يَبْلُغَا أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنْزَهُمَا رَحْمَةً مِنْ رَبِّكَ وَمَا فَعَلْتُهُ عَنْ أَمْرِي ذَلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِعْ عَلَيْهِ صَبْرًا)،[١]

(خزر وتی: ئەوا ئێستا بەپێی قسەی خۆت لەیەك جیادەبینەوە، کەمێکیتر حیکمەت و نهێنی ئەو ڕووداوانەت بۆ باسدەکەم، لەبەرامبەریانەوە بێ ئارام بوویت، هۆی کونکردنی کەشتییەکە، ئەمەبوو کە هی چەند کەسێکی هەژارو بێنەوا بوو، لەدەریادا ئیشیان پێدەکرد بۆ بژێوییان، بۆیە ویستم بە کونکردنی عەیبداری بکەم، چونکە لەپێشیانەوە پاشایەکی ستەمکار هەبوو، هەموو کەشتییەکی چاك و بێ عەیبی زەوت دەکرد، تا زەلاوەکەش (کەکوشتم)! دەمزانی کە سروشتی لەسەر بێبڕوایی و خوانەناسیی ئەڕوات و باوك و دایکیشی ئیماندارو موسڵمان بوون، جا ئێمەش ترساین بەسەرکەشی خۆی هەردوو لەخشتە بەرێ و ناچاریان بکات و هەڵیان بنێ بەرەو سەرکەشی و بێ بڕوایی، ویستمان بەوکارەیە پەروەردگاریان بۆیان

---

(١) الکهف: ٧٨-٨٢.

بگۆڕێ بەمنداڵێکی چاکترو پاکترو بە میهرەبانتر، دیوارەکەیش کە خەریك بوو ئەکەوت و ئێمەش بەخۆڕایی چاکمان کردەوەماڵی دووکوڕە بچکۆلەی هەتیو بوو لە شارەکەدا لەژێریا گەنجینەیەك هەبوو کە هی ئەو دوومنداڵە هەتیوە بوو، باوکیان بۆی دانابوون و باوکیشیان خواناس و پیاوچاك بوو، جا لەبەرخاتری بابیان، خوا پارێزگاری بۆ کردبوون، بۆیە ئێمەش ئەو کارەمانکرد، وتمان نەوەك لافاوێ دەری بخاو بفەوتێ، پەروەردگارت ویستی ئەودووانە کاتێ گەنجینەکەیان دەستکەوێتەوە بگەنە تەمەنی بلوغ و بەهێزبوون و ئەوسا خەزێنەی خۆیان لەژێر دیوارەکەدا دەربێنن، ئەمەیش بەزەیی و میهرەبانییەك بوو لەلایەن پەروەردگارتەوە بەرامبەر بەودوو کوڕە چکۆلەیە کردی لەبەر چاکی باوکیان، دڵنیاشبە لەخۆمەوە نەمکردووە، بەڵکو گشت بەفەرمانی خوا بووە، ئەوە روونکردنەوەی ئەوشتانە بوو کەتۆ نەتوانی بەرامبەریان خۆراگر بیت)

کێشەی نێوان عەقڵ و نەقڵ لەمرۆدا ئەوەیە کە کەسانێك نەقڵ هەتا ئەو سنوورە قبووڵ دەکەن کە پێوەرە عەقڵییە سنووردارە مرۆییەکانی سەرزەوی نێو رۆژگاری ئەمرۆ قبووڵی دەکەن، واتە عەقڵی سنوورداری مرۆیی هەم لە رووی کات و شوێن و بارودۆخ و دابونەریتیشەوە، دەکەن بە بڕیاردەر لەسەر نەقڵێك کە سنووری کات و شوێن و بارودۆخ و دابونەریتە ناوچەییەکانی تێپەڕاندووە.

ئەو کەسانەی لەم رۆژگارەماندا عەقڵ پێش نەقڵ دەخەن، دوو کێشەی سەرەکییان هەیە:

**یەکەمیان:** ئەوەیە کە دڵنیانەبوونەتەوە لە راستیی نەقڵ، دەبینیت زۆرێکیان گومانیان لە قورئان یان فەرموودە هەیە، هەندێکیان

ASTANA

بڕوایان بەوە نیە قورئان لای خواوە بێت، یاخود هەمووی نەقڵ کرابێت، هەندێکیشیان بڕوایان بەوە نیە فەرموودە بەشێك بێت لە نەقڵ، یاخود بە صەحیحی نەقڵ کرابێت.

**دووەمیان:** ئەوەیە کە بۆ تێگەیشتن لەو نەقڵە، تەنها عەقڵی خۆیان بەکاردێنن، عەقڵێك کە نابێت سنووری جوگرافی و بارودۆخ و سەردەمی خۆیان تێپەڕێنێت، ئەمەش ئەگەر پەسەند بکرێت، دەبێت بە لەکەیەك بۆ نەقڵ، چونکە کاتێك هەمان سنوور و بارودۆخ و زەمەن تێدەپەڕێت و مۆدێلێکی نوێی هەریەك لەوانە دێتەئاراوە، ئەوکات ئەگەر نەقڵ ملکەچی ئەو بەربەستانە بووبێت، لەمەی دواتردا کەلێن و کەموکورتیی پێوە دیار دەبێت.

نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر:

لە فەرموودەیەکدا هاتووە کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت:

(وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تُكَلِّمَ السِّبَاعُ الْإِنْسَ ، وَحَتَّى تُكَلِّمَ الرَّجُلَ **عَذَبَةُ سَوْطِهِ** وَشِرَاكُ نَعْلِهِ ، وَتُخْبِرَهُ فَخِذُهُ بِمَا أَحْدَثَ أَهْلُهُ مِنْ بَعْدِهِ)،[1]

(سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، ڕۆژی دوایی نایەت و قیامەت هەڵناسێت، هەتا ئاژەڵی دڕندە لەگەڵ مرۆڤدا قسە دەکات، هەتا سەری قامچی دەستی مرۆڤ و قایشی نەعلەکەی، قسە لەگەڵ

---

(١) مسند أحمد بن حنبل، الرقم ١١٩٧١، سنن الترمذي، باب ما جاء في كلام السباع، الرقم ٢١٨١ و قال حسن صحيح غريب.

مرۆڤدا دەکات، هەتا رانی پیاو هەواڵی پێ دەدات کە ژن و منداڵی لە دوای خۆی - لە ماڵەوە - چی دەکەن).

ئەم فەرموودە بە پێوەری عەقڵیی لە رووی کاتەوە، بۆ دوو سەدە لەمەوبەر بە نادروست تەماشا دەکرا، چونکە عەقڵی دوو سەدە لەمەوبەر هیچکات وێنای ئەوەی نەدەکرد بگونجێت ئاژەڵی درندە لەگەڵ مرۆڤدا قسە بکات، بۆیە ئاسایی ئەم فەرموودەیان بە هەڵبەستراو هەژمار دەکرد و تۆمەتیان دەدایە پاڵ ئەوانەشی کە نەقڵیان کردووە و نەقڵی فەرموودەیان دەخستە ژێر پرسیارەوە، تەنانەت ئەوانەشی کە پابەندی عەقڵ بوون بەڵام بەرپەرچیان نەدەدایەوە، لێکدانەوەی تریان بۆ دەکرد، وەك چۆن هەتا ئەمڕۆ زۆرێکیان وان، پێیان وایە مەبەست پێی دواندنی جەستەیی و تێگەیاندنی ئاژەڵەکانە، ئەوەی ئەمڕۆ پێی دەوترێت (سیرك).

بەڵام بۆ عەقڵی ئەمڕۆ ئاساییە ئەو فەرموودەیە پەسەند بکات، چونکە وێنای ئەوە دەکات بتوانرێت ئامێرێك بۆ مرۆڤ و ئاژەڵ دروست بکرێت کە زمانی یەکتر بۆ یەکدی وەربگێڕێت.

بە هەمان شێوە، عەقڵی دوێنێ قبووڵی ئەوەی نەدەکرد نەعل و پێڵاو قسە بکات، بەڵام عەقڵی ئەمڕۆ ئەوەی لا ئاساییە.

دواجار هەمان وتەی خزر دووبارە دەهێنمەوە کە لە سەرەتای یەکترناسینی لەگەڵ پێغەمبەر مووسادا، کاتێك لە کەنار دەریا وەستابوون و باڵندەیەك بە دەنووکی، شتێکی لە دەریا برد -ئاو بێت یان هەر شتێکی تر-، خزر و مووسایش تەماشای ئەو دیمەنەیان دەکرد، ئینجا خزر پێی وت: (وَاللهِ مَا عِلْمِي وَمَا عِلْمُكَ فِي جَنْبِ عِلْمِ اللهِ ، إِلَّا كَمَا أَخَذَ هَذَا الطَّائِرُ بِمِنْقَارِهِ مِنَ

ASTANA

الْبَحْرِ)،[١] (سوێند بەخوا زانستی من و زانستی تۆیش لەپاڵ زانستی خوادا، هەروەك ئەو کەمە شتەیە کە ئەو باڵندەیە بە دەنووکی لە دەریای برد).

(١) صحيح البخاري، كتاب تفسير القرآن، الرقم ٤٧٢٦.

# نێوەڕۆك



یەکێك لە پەندو وانە گرنگەکانی نێو ژیانی پێغەمبەر مووسا کە لە قورئاندا بـۆمان باســکراوە، راستکردنەوەی تێڕوانینمانە بەرامبەر رۆڵ و پێگەی عەقڵ لە ئاسـت ویسـتی خـــوادا، چـونکە زۆرجـــار لە ساتە یەکالکەرەوەکاندا، نــاتـــوانین تێڕوانینی عـــەقڵ تێپەڕێنین و لە بـــازنەی بەرتەسکی عەقڵی مرۆییدا خۆمان مۆڵ دەدەین.

بەســەرهاتی پێــغەمبەر مـــووسا کە لە قـــورئانی پـــیرۆزدا باسکراوە، بەجـوانی ئـەوەمان بۆ روون دەکاتەوە، لەودیو لێکدانەوەو حیساب و کیتابی عەقڵەوە، ویســـتی خـــوا هەیە، ئەوکاتەی لە روانگە عەقڵیی و واقیعیەکەوە دەگەیــنە قـــەناعەتێك، ویسـتی خـــوا شتێکی ترە و ویســتی خواش پێش لێکدانەوە مــرۆییەکان دەکەوێت، بــۆ ئەمەش شـــەش وێستگەی ژیانی ئەو پێغەمبەرە ئولولعەزمە بە نموونە وەردەگرین.

